# وانەی شانزە

## پیتەکانی چرپە و پیتە بەرەو ژوور بوەکان

## حروف الهمس و حروف الإستعلاء







ماموٚستا: لەم وێنەیەدا چی ئەبینی احمد؟

احمد پیتەکانی إستعلاء و پیتەکانی الهمس ئەبینم.

ماموٚستا: پیتەکانی إستعلاء چەندن بیان ژمێرە ؟

احمد: ژمارەیان حەوت پیتە کەئەمانەن( خ،ص، ض، غ، ط، ق، ظ ) کۆی ئەم پیتانەئەم ڕستەی لێ دروست ئەبێت.

(خص ضغط قظ)

ماموٚستا: پیتەکانی الهمس چەندن بیان ژمێرە؟

احمد: ژمارەیان دە دانەن کەئەم ڕستەی لێ دروست ئەبێت:

( فحثه شخص سكت )

ماموٚستا: ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان پیتەکانی ( الهمس ) و ( إستعلاء )؟

احمد: بەڵێ جیاوازی هەیە لەهەمسا سکون بەمەرج ئەگیرێ بەڵام ئیستیعلاء پەیوەندی نیە بەسکونەوە.

مامۆستا: مەبەست چی‌یە لە ئیستیعلاء لەزانیاری تەجویددا؟

احمد: مەبەست لەو پیتانەیە کەلە کاتی دەرچوونیانا بەشێوەیەکی قورس و قەڵەو دەر ئەبڕێن.

مامۆستا: ئایا لەهەموو کاتێکا پیتەکانی ئیستیعلاء بەقوورسی ئەوترێن؟

احمد: کاتێ پیتەکانی ئیستیعلاء فەتحە و ضمە و سکونی هەبێ بەقووروسی ئەخوێندرێتەوەنمون(قَال- القُرْان- و العَصر).(١)

مامۆستا: واتای هەمس چی‌یە؟

احمد: دەربڕینی ئەو پیتانە بەشێوەی چرپە، لەکاتی وتنیانا بەدەنگێکی هێواش نزم ئەوترێ و هەناسەی لەگەڵدا دەر ئەچێ لەبەر ئەوەیە بەهەمس ناوئەبرێ.

مامۆستا: پیتە چرپەکان ئەکەونە کوێی‌ووشەوە؟

احمد: ئەکەونە ناوەراست و کۆتایی‌یەوە بەمەرجێ ساکین بن نمونە:
(یحکم – بما کسبت)(٢)

***تێبینی:***

(١) حەرفەکانی ئیستیعلاء لەیەک حاڵەتدا بەبچووکی دەخوێندرێتەوە هەر کاتێک(کەسرەی) لەژێر دابێت- غسلین- قیل.

(٢) حروفەکانی هەمس لەناوەراستی وشەدا بەکەمی دەردەخرێت بەڵام لەکۆتایدا بەپێچەوانەوە.

راهێنان

*خوای پاک و بێگەرد ئەفەرموێت:*

**١- ن وَالْقَلَمِ وَمَايَسْطُرُونْ.**
**٢- وَإِنَّ لَأَجراً غَيرَ مَمْنُونْ.**
**٣- إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيهِ آيَاتُنا قَالَ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينْ.**
**٤- يَومَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَ يُدْعَونَ إِلَى السُّجودِ فَلا يَسْتَطِيعُونْ.**
**٥- وَمَاهُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلعَالَمِينْ.**

# وانەی حەقدە

## یاساکانی (ڕا)

## أحكام الراء

مامۆسا: چەند جۆر (راء) هەیە؟

احمد: دوو جۆر لکاوو وەستاو، ئەگەر بکەوێتــە سـەرەتاو ناوەراسـتەوە ئـەوە لکـاوە نمونە: (رهبانا- أرسلنا- غفور رحيـــم) بـەلام ئەگـەر لـەکۆتایی ووشـەدابێ بوەسـتین لەسەریئەوە وەستاوە نموونە(يا أيها المدثر).

مامۆستا: ئایا(ر) سووک و قوورس هەیە؟

احمد: بەڵێ لەکاتی وەستان و لکاو (ر)ی قوورس و سوک هەیە.

مامۆستا: ئەو حاڵەتانەی (ر) بڵێ کەسوکە لەکاتی لکاودا؟

احمد: لەدووکاتدا (ر) سووکە.

١- کاتێ کەسرەی هەبوو(رِجال) و (من يرِد).

٢- کاتێ خۆی سکونی هــەبێ پیتەکەی پێشـی کەسـرەی هـەبێ بەمـەرجێ بـەدوایا پیتی ئیستعلاء نەهاتبێ نموونە(فِرْعَون).

ولەشەش کاتدا قورسە:

١- ئەگەر فەتحەی هەبوو نمونە(الرَّشاد، الرَّحمة).

٢- ئەگەر ضمە ی هەبوو نموونە(أولك يتفكرُوا، الذين صبرُوا).

٣- ئەگەر سکونی هەبوو پێشی فەتحە بوو نموونە(مَرْحمة، عَرْش).

٤- ئەگەر سکونی هەبوو پێشی ضمە بوو نموونە(مُرْسلين، مُرْضعة).

٥- ئەگەر سکونی هەبوو پێشی کەسرەی نائەسڵی بوو نموونە (أَمِ ارْتابُوا).
لەبەر گەیشتنی دووساکین بەیەکتر (التقاء الساكنين) میمەکە کەسرەی وەرگرتووە.

لەبەر ئەوە پێی دەوترێ کەسرەی نا ئەصڵی

٦- ئەگەر سکونی هەبوو پیشی کەسرە بوو بەدوایا پیتی ئیستیعلاء هات بوو ،موونە(قرطاس، مرصاد).

مامۆستا: ئایا لەکاتی وەستانا(ر) قوورس و سووکی هەیە؟

احمد: بەڵێ، لەکاتی وەستانا لەسێ کاتا بەسووک ئەخوێنرێتەوە:

١- ئەگەر (ى) لە پیشیا بێت نمونە(خبير، قدير).

٢- ئەگەر کەسرە لە پیشیا بێت نمونە(يا أيها المدثِر).

٣- ئەگەر پیشی ساکین بوو بەڵام پیتی ئیستعلاء نەبوو وەپیش ئەو پیتە ساکینە کەسرەی هەبێ نمونە(السِحْر،الشِعْر).

وەلەپێنج کاتا بەقوورسی ئەخوێنرێتەوە لەکاتی وەستانا:

١- ئەگەر پیشی فەتحەی هەبوو (إنها لإحدى الكبَر).

٢- ئەگەر پیشی ضمە ی هەبوو (نُكُر).

٣- ئەگەر پیشی (ألف) ساکین هەبوو (غفّار).

٤- ئەگەر پیشی (واو) بێت (غفورْ).

٥- ئەگەر پیشی ساکین بێ وە لەپیش پیتە ساکینەکەوە فەتحە هەبێ(النَصْر).

لەدووکاتدا (راء) بەقوورس وسووک ئەخوێنرێتەوە واتە بە ئارەزووی خوێنەر خۆیەتی قورس دەری بڕێ یان سووک کاتێک کە پیشی پیتێکی ئیستیعلاء ساکین بێت و پێشی کەسرەی هەبێ (مِصْــــر) کاتێکیش بە دوایدا پیتێکی ئیستیعلاء کەسرە دار هەبێ و لەپێشیەوە کەسرەی ئەصلی هەبێ (فكان كلُّ فِرْقٍ)

## راهێنان

خوای پاک و بێ گەرد ئەفەرموێت:

١- وَثِيابَكَ فَطَهِّرْ.

٢- إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ.

٣- وَ ما أَدْراكَ ما سَقَر.

٤- كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَة.

٥- فَمالَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِين.

# وانەی هەژدە

## پیتەکانی قەلقەلە

## حروف القلقلة

مامۆستا: پیتەکانیقەل قەلە چەندن بیان ژمێرە؟

احمد: پێنج پیتن کەئەمانەن(ق، ط، ب، ج، د).

کۆی ئەم پیتانە ئەم ڕستەیەی لێ دروس ئەبێت(قطب جد) بەمەرجێ ساکین بن.

مامۆستا: قەل قەلە چی یە احمد؟

احمد: لەکاتی دەرچوونی ئەم پیتانەدا لەرینەوە لەناو دەمدا دروست دەبێت.

مامۆستا: قەل قەلە چەند جۆرە؟

احمد: دوو جۆرە: گەورە و بچووک، بچووک ئەوەیە کە بکەوێتە ناوەراستی ووشـەوە نمونە: (يَدْخلون- مُبْصِرون)، گەورەش ئەوەیە کەبکەوێتە کۆتاییووشەوە(الفَلَق- مُحِيط- قَرِيب).

## پیتەکانی مینگە (حروفا الغنة)

مامۆستا: پیتەکانی مینگە چەندانەیە احمد؟

احمد: دوانن: کاتێک(م + ن) شەددەیان هەبوو مینگە وەردەگرن (ثُمَّ- إنَّكُم).

## ووتنی ناوی خوا(الله) (لفظ الجلالة)

مامۆستا: بەچەند جۆر (الله) ئەخوێندرێتەوە؟

احمد: بەسووک و قورس ئەخوێندرێتەوە.

مامۆستا: کەی بەقورس و کەی بەوسووک ئەخوێندرێتەوە؟

احمد: لەسێ کاتدا بەقوورس ئەخوێندرێتەوە:

١- هەرکاتێک بکەوێتە سەرەتاوە(اللّه لا إله إلا هو الحي القيوم).

٢- ئەگەر پێشی فەتحە بوو(قل هوَ اللّه أحد).

٣- ئەگەر پێشی ضەمە بوو(يدُ اللّه فوق أيديهم).(*)

لەیەک کاتدا بەسووکی ئەخوێنریتەوە کەپێشی کەسرە بێ یان تەنوین بێ کەبە(نِ) کەسرە دار دەخوێندرێتەوە وەک(بسم ِالله - قوماً نِ الله) (*)

*خوای پاک و بێگەرد ئەفەرموێت:* راهێنان

**١- فَإِنَّ الجَنَّةَ هِيَ المَأوىٰ.**

**٢- ماذا أرادَ اللّهُ بِهٰذا مَثَلاً.**

**٣- قُل أَعوذُ بِرَبِّ الفَلَقْ.**

**٤- ثُمَّ أَدبَرَ وَاسْتَكبَر.**

**٥- بِسْمِ اللّهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمْ.**

**٦- اَللّهُ نورُ السَّمٰواتِ وَالأَرضْ.**

## تاقی کردنەوەی دیاری کراو

١) ناوی ئەو پیتانە بڵێ کە هێڵیان بەژێرا هاتوە.

*خوای پاک و بێ گەرد ئەفەرموێت:*

**فَسَتُبْصِرُ وَ يُبْصِرونْ.**

**إذا تُتلىٰ عَلَيهِ آياتُنا قالَ أَساطيرُ الأَوَّلينْ.**

**فَانطَلَقوا وَهُمْ يَتَخافَتونْ.**

٢) جۆرەکانی قەلقەلە لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا دیاری بکە؟

**أَفَنَجعَلُ المُسلِمينَ كَالمُجْرِمينْ.**

**لاأُقسِمُ بِهٰذا البَلَدْ.**

٣) بەچەند جۆر (اللّٰه) ئەخوێندرێتەوە نموونەش بۆ هەر جۆرێکی بێنەرەوە؟

٤) بۆچی (راء) لەم وشانەدا بەقوورس ئەخوێندرێنەوە؟

(رَبك- يتذكرُ الإنسان- مِرْصاد- يَنْصُرُوْن).

بۆچی (راء) لەو وشانەدا بە سووک ئەخوێندرێنەوە؟

(مِرْيَة- مُخَيِّرْ- قَدير- فِرْقٍ).

٥) دوو نمونە بۆ قەل قەلەی بچوک و دوو نمونە بۆ قەلقەلەی گەورە بێنەرەوە هۆی دروست بوونەکەشی بڵێ؟

٦) لەچەند کاتدا (راء) بەسووک ئەخویندرێتەوە؟ نموونەش بێنەرەوە.

٧) پیتەکانی پووک بژمێرە؟ بۆچی پێی ئەوترێ پیتەکانی پووک(اللثوية).

٨) پیتە بەرەو ژوور چوەکان، پیتە چرپەکان( حروف الإستعلاء و حروف الهمس).

لەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوەدا دیاری بکە؟

تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ.

أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ.

فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً.

نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً.

# بەشی سێیەم

# ڕەوشتەکانی پیت (صفات الحروف)

## وانەی نۆزدە

## مەد (المد)

١) قو ـــــــ قا ـــــــــــــ قي.

٢) خوف ـــــ صيف ـــــــــــ قريش.

مامۆستا: لەکومەڵەی یەکەمدا چی ئەبینی احمد؟

احمد: (واو) ی ساکین ئەبینم پێشی ضەمەیە (الف) ساکین ئەبینم پێشی فەتحەیە (یاء) ساکین ئەبینم پێشی کەسرەیە. (نُوحِيهَا)

مامۆستا: لەکۆمەڵەی دووەمدا چی ئەبینی احمد؟

احمد: (واو) و (یاء) ساکین ئەبینم پێشیان فەتحەیە.

مامۆستا: لەمەوە بۆمان دەر ئەکەوێ کە پیتەکانی مەد سیانن:

(الف) ساکین پێشی فەتحە بێ (واو) ساکین پێشی ضەمە بێ (یاء) ساکین پێشی کەسرە بێ،مەدە نەرمەکانیش (مد اللين) (واو) و (یاء) پێشیان فەتحە بێ.

مامۆستا: مەد درێژ کردنەوەی ئەم پیتانەیە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بەپێی جۆری مەدەکە بەڵام ئەگەر ئەم پیتانە گەیشتن بەهەمزە ی لکاو (همزةالوصل) ئەوامەدەکە نامێنێ نمونە:

(إهدنا الصراط) (كرسيه السموات) (وعملوا الصالحات).

واتـە: هـەرکاتێک حەرفـەکانی مـەد (ا- و- ی) بگـەن بەهـەمزەی وەصـــل درێـژ ناکرێنەوە.

## جۆرەکانی مەد( اقسام المد )

مامۆستا: مەد ئەکرێ بەچەند جۆرەوە؟

احمد: ئەکرێ بە دوو جۆرەوە بنچینەیی‌و لاوەکی(أصلي و فرعي).

مامۆستا: مەددی بنچینەی (الأصلي) چی‌یە؟

احمد: مەددی أصلیٰ پێشی ئەوترێ مەددی سروشتی (مد الطبیعي) هەرکاتێ پێشی (یاء) کەسرە بـێ وەپێشـی (الـف) فەتحـەبێ وەپێشـی (واو) ضەمـــە بـێ بەمـەرجێ بەدوایان دا هەمزە و سکون نەهاتبێ.

مامۆستا: ئایا مەددی سروشتی(الطبیعي) ئەکەوێتە سەرەتای سورەتەکانەوە.؟

احمد: بەڵێ هەموو ئەوسورەتانەی کە بە پیت دەست پێ دەکات مەددی(طبیعي)یـە بەمەرجێ پیتەکە لەدوو حەرف پێک هاتبێ. نمونە:

(حـم) پیتـی (حـا) مـەددی سروشـتی‌یە(یـــس) پیتـی(یا) بـە هـەمان شـێوە حەرفی(ح) دوو پیتە (ح+ ا) (ی) (ی+ا).

مامۆستا چەند جووڵە (حرکة) درێژ ئەکرێنەوە احمد؟

احمد: مەددی سروشتی دوو جوڵە درێژ ئەکرێتەوە.

***تێبینی:***

ئەو حەرفانەی مەددی طبیعي تێدا دروست دەبێت دیاری کراون لەم حەرفانەدا(حـــي طهُر ) (ح- ی- ط- هـ- - ر).

مامۆستا : جیاوازی چی‌یەلەنێوان مەددی بنچینەیی و مەددی لاوەکی‌دا(المد الأصلـي و المد فرعي)؟

احمد: مەددی فەرعی ئەوەستی لەسەر(همزة) و (سکون) بەلام مەددی بنچینەیی ناوەستی لەسەریان.

مامۆستا: مەددی لاوەکی ئەکرێ بەچەند جۆرەوە؟

احمد: ئەکرێ بە دوو جۆرەوە:

١) کاتێ لەسەر هەمزە ئەوستی ئەکرێ بەسێ جۆرەوە:

ا- مەددی لکاو(المد المتصل). ب- مەددی جیا(المد المنفصل). ج- مەددی گۆڕاو (مد البدل).

٢) کاتێ لەسەر سکون ئەوەستی ئەکرێ بەسێ جۆرەوە:

ا- مەددی پێویست(مد اللازم). ب- مەددی تووش بونی سکون(مد عارض للسكون). ج- مەددی نەرم(مد لين).

## ڕاهێنان

خوای پاک و بێ گەرد ئەفەرموێت:

١- إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ

٢- الٓرٰ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ.

٣- طٰسٓمٓ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ.

٤- طٰهٰ مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ.

٥- يٰسٓ. وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ.

# وانەی بیست

## مەددی لکاو ( المتصل ) مەددی جیا( المنفصل ) مەددی گۆڕاو( البدل )

| | | |
|---|---|---|
| ١) ملآئكة | جىٓ | متصل |
| ٢) يآ أيها | إنيٓ آمنت | منفصل |
| ٣) ءآمن الرسول | ءآدم | بدل |

مامۆستا: کۆمەڵەی یەکەم بخوێنەرەوە احمد؟

أحمد: ملآئِكَةَ - جيٓءَ

مامۆستا چی تێبینی ئەکەی؟

احمد: تێبینی ئەوە ئەکەم (الف) ساکین هاتوە، پێشی فەتحەیە و لەدواشیەوە هەمزە هاتوە لەووشەی یەکەمدا وەلە ووشەی دووەمدا (یاء) ساکین هاتوە پێشی کەسرە یەو لەدواشیەوە هەمزە هاتووە.

مامۆستا: ئایا مەددەکە ئەکەوێتە ووشەی یەکەمەوە یان ئەکەوێتە سەر هەمزەکە؟

احمد: مامۆستا هەردووکیان یەک ووشەن لەبەرئەوەیە پێیان ئەوترێ مەددی لکاو (المد المتصل).

مامۆستا: کۆمەڵەی دووەم بخوێنەرەوە؟

احمد: يآ أيها – إنيٓ آمنت.

مامۆ ستا: چی تێبینی ئەکەی؟

احمد: تێ بینی ئەوە ئەکەم لەڕستەی یەکەمدا (الف)ی ساکین هاتوە پێشیفەتحەیە وەلەدواشیەوە هەمزە هاتوە لەڕستەی دووەمدا (یاء)ی ساکین هاتوە

پێشی کەسرەیەو لەدواشی‌یەوە هەمزە هاتووە، بەڵام هەست ئەکەم مەدەکەلەبەیەک گەیشتنی دوو ووشەی جیاوازدا دروست بووە.

ماموستا: بەڵی هەر لەبەر ئەوەیە پێی ئەوترێ مەددی جیا (مد المنفصل).

ماموستا: مەددی (منفصل) و مەددی(متصل) چەند جوڵە درێژ ئەکرێنەوە؟

احمد: مەددی (منفصل) ئەتوانرێ‌دوو جوڵە چوار جوڵە پێنج جوڵە درێژ بکرێتەوە بەڵام مەددی متصل پێویستە (واجب)ە چوار جوڵە یان پینج جوڵە درێژ بکرێتەوە.

ماموستا: کومەڵەی سێیەم بخوێنەرەوە احمد؟

أحمد: آمن الرسول — آدم.

ماموستا: تێبینی چی ئەکەی؟

احمد: تێبینی ئەوە ئەکەم کەپیتە مەدەکان لە پێشیانەوە هەمزە هاتوە(آمـــن) لە بنچینەدا(أ آمن) بوە(آدم) لە بنچینەدا(أ آدم) بوە.

ماموستا: لەمەوەبومان دەر ئەکەوێ کەمەددی گۆڕاو (بدل) ئەوەیە هەر کاتێ لەپێش‌پیتی مەدەوە هەمزە بێ ئەوا هەمزەکە ئەگۆڕێ بۆ مەد دوو جوڵە درێژ ئەکرێتەوە، لەبەر ئەوە پێی ئەوترێ مەددی گۆڕاو(المد البدل).

## ڕاهێنان

خوای پاک و بێ گەرد ئەفەرموێت:

١- يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ.

٢- وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ.

٣- قُلْ هُوَ الرَّحْمَٰنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا.

٤- وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ.

٥- وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَىٰ آمَنَّا بِهِ.

# وانەی بیست و یەک

## مەددی پێویست ( مد اللازم )




ماموٚستا: مەددی پێویست( اللازم ) چی‌یە؟

احمد: ئەوەیە کەهەر کاتێ یەکێ لە پیتەکانی مەد بگات بە پیتێکی ساکن نمونە( الحاقّة ) لە بنچینەدا( الحاققة )یە ( الطّامة ) لە بنچینەدا( الطاممة )یە لەهەردوو نمونەکەدا ( الف ) ساکین گەیشتوە بە(قاف)ی ساکین لەنمونەی یەکەمدا لە دووەمدا گەیشتوە بە( میم )ی ساکین.

ماموٚستا: چەند جۆر مەددی لازم هەیە؟

احمد: ئەگەر کەوتە نێوانی ووشەوە پێی ئەوترێ مەددی وشەیی (مد کلمي ) نمونە( الضّالّين ) وە ئەگەر لەپیتا بێ پێی ئەوترێ مەددی پیتی(مد حرفيا ) نمونە: ( ق- ن ).

ماموٚستا: مەددی پێویست ئەکرێ بەچەند بەشەوە؟

احمد: مەددی پێویست ئەکرێ بەچوار بەشەوە؟

١) پێویستی ووشەیی قوورس (لازم کلمي مثقل )

٢) پێویستی ووشەیی سووک (لازم کلمي مخفف ).

٣) پێویستی پیتی قورس (لازم حرفي مثقل).

٤) پێویستی پیتی سووک (لازم حرفي مخفف).

*١) (لازم كلمي مثقل):*

مامۆستا: مەددی پێویستی ووشەی قورس چی‌یە؟

احمد: هەرکاتێک بەدوای‌پیتە مەددەکانا پیتێکی شەددە دلر بێت وەک (الصَّآخَّـــةُ- ولا الضَّآلِّينَ- أتحآجُّونِّي).

*٢) (لازم كلمي مخفف):*

مامۆستا: مەددی پێویستی ووشەی سووک چی‌یە؟

احمد: هەر کاتێک بەدوای پیتی مەددا پیتێکی سووک بێ نمونە (آلْآنَ) کەلە قورئاندا تەنها ئەم ووشەیە هاتووەدووجار لە سوورەتی(یونس) دا لە خوێندنەوە(حفص عن عاصم)دا بەم جۆرە ئەخوێنرێتەوە.

مامۆستا: مەددی پێویست چەند جوڵە درێژ ئەکرێتەوە؟

احمد: مەددی لازم هەر چوار جۆرەکەی لە(٦) حەرەکە زیاترو کەمتر نابێت.

## راهێنان

*خوای پاک و بێ گەرد ئەفەرموێت:*

١) الحَآقَّةُ. مَاالحَآقَّةُ. وَمَآ أدْرَاكَ مَا الحَآقَّةُ.

٢) وَإِذَا رَأَوْهُم قَالُوا إِنَّ هَؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ.

٣) فَإِذَا جَآءَتِ الطَّآمَّةُ الكُبْرَى.

٤) وَالصَّآفَّاتِ صَفّاً. فَالزَّاجِرَاتِ زَجْراً.

٥) ءَآلْئٰنَ وَقَدْ عَصَيْتَ

# وانەی بیست و دوو

## مەددی پێویستی پیتی (المد اللازم الحرفي)

لازم حرفي مخفف: ألم (م)    طسم(م).

لازم حرفي مثقل: الم(ل)    طسم (س).

**ماموٚستا:** مەددی پێویستی پیتی چییە؟

**احمد:** هەر هەمان مەددی پێشوە بەڵام ئەم لەوشەدا دروستنابێت بەڵکو لە پیتدا دروست ئەبێت و بەردەوامیش ئەکەوێتە سەرەتای سورەتەکانەوە نمونە(قٓ- نٓ).

**ماموٚستا:** ئەگەر بیرت بێ لەسەرەتاوە وتمان مەددی سروشتی (الطبيعـــي) ئەکەوێتەسەرەتای سورەتەکانەوە ئایا جیاوازی ئەم دوو جۆرە مەددە چییە؟

**احمد:** مەددی سروشتی لەدوو پیتدا دروست ئەبێت نمونە(حمٓ) بە خوێندنەوە (حامیم) پیتی (حا) مەددی سروشتییە، بەڵام مەددی پێویستی پیتی(لازم حـــرفي) لەسێ پیتا دروست ئەبێت نمونە(قٓ- نٓ-حمٓ) بەخوێندنەوە(قاف- نون- میم) (ق+ا+ف).

**وانە:** مەددی لازمی حەرفی لەو وشانەدا دروست دەبێت کەلە سێ پیت پێک هاتوون بەو مەرجەی حەرفی ناوەڕاستیان حەرفی مەد بێت.

کۆی پیتەکانی مەددی پێویستی پیتی(لازم حرفی) لەم ڕستەیەدا کۆبوتەوە(نقص عسلکم).

**ماموٚستا:** (لازم حرفی مثقل) جیاوازی چییە لەگەڵ (لازم حرفي مخفف).

احمد: مەددی (لازم حرف مثقل) لە کۆتایی مەدەکەدا تیّ هەڵ کیّش ئەکریّ لەگەڵ پیتێکی تردا نمونە(الٓمٓ)کە(م)ی لامەکە تیّهەڵکیّش نەکریّ لەگەڵ کۆتایی میمەکەدا بەلام مەددی(لازم حرف مخفف) تیّهەڵکیّش ناکریّ لەگەڵ هیچ پیتێکا نمونە(طٓسٓمٓ) میمەکەی کۆتایی

مامۆستا: ئەم دوو جۆرە مەددەچەند جولەدرێژ ئەکرێنەوە ؟

احمد: هەمووپیتەکان ئەبیّ شەش جوولە درێژ کرێنەوەتەنها پیتی(عَین)نەبیّ کەئەتوانریّ دووجولە تا شەش جولە درێژ بکرێتەوە .

## . ڕاهینان

*خوای پاک وبیگەرد ئەفەرموێت:*

**١) نٓ والقَلَمِ وَما يَسْطُرُونْ .**

**٢) طٰسٓمٓ . تِلكَ آياتُ الكِتابِ المُبِينُ**

**٣) الٓرٰ تلكَ آياتُ الكِتابِ الحَكِيمُ**

**٤) كٓهيٰعٓصٓ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا.**

**٥) صٓ وَالقُرآنِ ذِي الذِّكْرْ .**

# وانەی بیست و سێ

## مەددی تووش هاتوو بە سکون ( المد العارض للسكون )

١) غفار رحيم قادرين مد عارض للسكون

٢) قريش خوف البيت مد لين

مامۆستا : مەددیتووش هاتو بەسکون (العارض للسكون ) چیيە ؟

احمد : ئەو مەدەیە کەبە دوای پیتێکی مەددا پیتێکی ساکین بێت لەبەر ئەوە دروست ئەبێت کەئەوەستی لەسەری نمونە: غفارْ-وَدُوْدْ-رَحِيْمْ، هەمیشە ئەم جۆرە مەدەئەکەوێتە کۆتایی ئایەتەوە یان شوێنی وەستان .

مامۆستا: چەند جوڵە دریژ ئەکرێتەوە؟

احمد: دوو جوڵەوچوار جوڵەوشەش جوڵەدرێژ ئەکرێتەوە .

مەددی نەرم(مد اللين) .

مامۆستا : مەددی نەرم چیيە (مد اللين) ؟

احمد : هەر کاتێک (واو) و(ياء) ساکین بوون ولە پێشیانەوە پیتێکی فەتحەدار هات مەددی لین دروست ئەبێ.

نمونە: البيت-خوف-قريش

مامۆستا:-مەددی لین چەند جوڵە درێژ ئەکرێتەوە ؟

احمد: دوو جوڵەوچوارجوڵەوشەش جوڵە درێژ ئەکرێتەوە .

**ڕاهێنان**

*خوای پاک وبێ گەرد ئەفەرموێت:*

١) لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ .

٢) وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ .

٣) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

٤) فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ .

٥) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ .

# وانەی بیست وچوار

## مەددی پیتی (هاء)ی ڕاناو (مد هاء الضمیر)

مامۆستا: مەددی ڕاناو چیە ؟

احمد: مەددی (هاء)ی ڕاناو مەبەست لەئامادەنەبویەکە (الغائب) بەردەوام ئەکەویتە کۆتایی ووشەوە نمونە ربه-آتیناه .

مامۆستا: لەچەند کاتدا (هاء)ضەمیر ئەبێ بەمەد ؟

احمد: لەدوو کاتدا ئەبێ بەمەدولەدووکاتیشدا نابێ .

١) کاتێ خۆی جوڵاو بێ (متحرك) وپیتەکەی پێشی جوڵاو بێت و دروست ئەبێ نمونە .(لاتَأْخُذُهُ سِنَةٌ) بەخوێندنەوە (تَأْخُذُهُو) (يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً) بەخوێندنەوە (بِهِي) لەم کاتەدا ناونەبرێ بەپەیوەندی بچوک (صِلَةُ صُغرىٰ) دووجوڵەش درێژ ئەکرێتەوە (*)

٢) کاتێ خۆی جوڵاو بێ و پیتەکەی پێشیشی جوڵاو بێ وبەدوای‌دا (همزە) هاتبێ نمونە (مَالَهُ أَخْلَدَهُ-عِنْدَهُ إِلَّا) ناونەبرێ بەپەیوەندی گەورە (صِلَـةُ كُـبرىٰ) بەئەندازەی مەددی جیا (المنفصل) درێژ ئەکرێتەوە .بەڵام ئەگەر خۆی ساکین بێ یان پێشی ساکین بێ ئەوا دروست نابێت نمونە: (خَلَقَـهُ-عِنْـدَه-مِنْـهُ-عَنْـهُ) بەڵام ووشەی (فِيـهِ) کەلەسورەتی (الفرقان) دا هاتووە (وَيَخْلُد فِيـهِ مُـهاناً) ئەوە (شاذ)ە وە لەو شوێنەدا بەئەندازەی مەددی سروشتی (طبیعی) درێژ ئەکرێتەوە .

### ڕاهێنان

*خوای پاک وبێگەرد ئەفەرموێت:*

١) أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ .
٢) يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ .
٣) بَلَىٰ إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيراً .
٤) وَيَنقَلِبُ إِلَىٰ أَهْلِهِ مَسْرُوراً .
٥) إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ .

## یاد خستنەوەیەکی سوود بەخش
## ئەومەددانەی کەلەسەر هەمزە ئەوەستن

١) المدالمتصل

٢) المد المنفصل

٣) المد البدل

**ئەو مەددانەی کەلەسەر سکون ئەوەستن .**

١) المد اللازم الكلمت　　ا) الكلمي مثقل

　　ب) الكلمي مخفف

٢)المد اللازم الحرفى　　ا) الحرفى مثقل

　　ب) الحرفى مخفف

٣) المد العارض للسكون.

٤) المد اللين.



# وانەی بیست و پێنج

## چەند مەددیکی تر

١- مەددی تەمکین: بریتیە لەبەیەک گەیشتنی دوو(یاء) لەیەک وشەدا، وەدووحەرەکە دریژ دەکریتەوە مەرجە (یاء)ی یەکەم کەسرە و شەددەی هەبێت وە(یاء)ی دووەم کەسرەی هەبێت.

وەک: حُيِّيتُمْ- النَّبِيِّينَ

٢- مەددی عوض: ئەم مەددە لەحاڵەتی وەستاندا دروست دەبێت لەسەر هەر حەرفێک کەبەتەنوینی فەتحە کۆتایی بێت.

وەک: إنا أَنْشَأْناهُنَّ إِنشاءً ، إِنَّ اللهَ كانَ عليماً حَكيماً، وَبَثَّ فِيهِما رِجالاً كَثِيراً وَنِساءً.

ئەم حاڵەتانە بەم شێوەیەی لێ دێت: -إنشائا - نســــائا - وە دوو حەرەکە دریژ دەکریتەوە.

٣- مەددی الفرق: بریتیە لەو دریژکردنەوەیە کە دەبێتە جیاکردنەوە لەنێوان هەمزەی پرسیار و (الف)ی تەعریف وە (٦) حەرەکە دریژدەکریتەوە تەنها -٤- جار هاتووە.

١) سورەتی الأنعام، ئایەتی ١٤٣ ووشەی ءآلذكرين.

٢) سورەتی الأنعام ، ئایەتی ١٤٤ ووشەی ءآلذكرين.

٣) سورەتی یونس، ئایەتی ٥٩ ووشەی ءآللهُ.

٤) سورەتی النمل، ئایەتی ٥٩ ووشەی ءآللهُ.

### تاقیکردنەوەی دیاری کراو

١) جۆری ئەوانە بلێ کەهێلیان بەژێرا هاتووە .

*خوای پاک وبێ گەرد ئەفەرمویت:*

١) الحَاقَّةُ .مَا الْحَاقَّةُ .

ی بکەین لەگەڵ ئایەتەکەی تردا

لەسەر ووشەیەك کەمانای ئایەتکە
وایدا دێ نەلەمانادا وەنەلە

ستی. نمونە: ﴿هَـذَا ذِكـرٌ ع وَ إنَّ

ه پەیوەندی نییە بەوڕستەیەی کە

ەم وەستانە وەك حوکمی وەستانی
ی نییە بەوەی بەدوایدادێ لەڕووی
نە وەك وەستان لەسەر (نُفوسکم)
وا صالحین فانَّه کان...﴾ الأسراء:

ستانە دروستە باش وایە بەوەی کە
ەر کۆتایی ئایەت بو هیچی تیانییە
یەتێکی ترە.
باش. دەگەیەنێ بەڵام لەڕوی ماناو
ێ وەلەناوەڕاستی ئایەت و کۆتایی

العالمین﴾ کەوەستان لەسەر (الله)
﴿رب العالمین﴾ باش نییە چونکە
وە لەبەر ئەوە پێویستە بە (الحمد

ەیەك کەمانایەکی تەواو نابەخشی
زمانەوانیەوە.



٢) إنَّا لَمَّا طَغَا المآءُ حَمَلناكُمْ فِي الجارِيَةِ
٣) تَنزِيلٌ مِنْ رَبِّ العالَمِينْ .
٤) فَلْيَعْبُدوا رَبَّ هٰذا البَيتْ .

٢) جۆری ئەم مەدّە ضەمیرانە دیاری بکە:
١) أَنِ اعْبُدُوا اللهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونْ .
٢) قالَ نوحٌ رَبِّ إنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَنْ لَمْ
٣) إنَّا أرْسَلنا نوحاً إلىٰ قَوْمِهِ أنْ أنذِرْ قَوْمَكَ

٣)

ا-مەددی نەرم (لین) چییە ؟

ب-مەددی پێویست( لازم ) دابەش ئەکرێ

ج- جیاوازی چییە.لەنێوان مەددی سروشـ

لازم حەرفی.

د- جیاوازی چییە لەنێوان مەددی لکاو(ا






- مد
  - مدی طبیعي - أصلي
  - مدی فرعی
    - ئه و مه دددانه ی به هۆی هه مزه وه دروست ده بن
      - مدی واجبی متصل
      - مد جائز منفصل
      - مد بدل
      - مد صلة كبرى
    - ئه و مه ددانه ی به هۆی سکونه وه دروست ده بن
      - مد عارض للسكون
      - مد لين
      - مد عوض
      - مد لازم
        - مد لازم كلمي مثقل
        - مد لازم كلمي مخفف
        - مد لازم حرفي مثقل
        - مد لازم حرفي مُخفف

- مد تمكين
- مد صلة صغرى
- مد الفرق

# وەستانەکان لەقورئاندا
## ( الوقوف )

چەند جۆرێك وەستان هەیە لەقورئاندا کە ئەمانەن:

١- (وقف الأضطراری) وەستانی ناچاری: ئەمە بەهۆی هەناسە تەواو بوون یان تەنگە نەفەسی یان کۆکە و پژمینەوە ڕوودەدات.

٢- (وقف الأختیاری) وەستانی تاقی کردنەوە: ئەمە بۆ تاقی کردنەوەی قوتابی دەبێ لەلایەن مامۆستاکەیەوە یان بۆ فێربوونی ووشەیەك کە بزانێ لەکاتی وەستان و ڕۆیشتندا چۆن دەخوێندرێتەوە.

٣- (وقف الأنتظاري) وەستانی چاوەڕوانی: ئەم وەستانە کەلەسەر ووشەیەك دەوەستی چاوەڕوان کردنە بۆ ئەوەی شێوازی خوێندنەوەکەی بچەسپێنێ لەمێشکیدا وەجوان وەری بگرێ.

ئەم سێ حاڵەتە وەستان لەسەریان دروستە بەوە دەست دەکەینەوە بەقورئان خوێندن ئەگەر دروست بوو دەست پێ کردنەوە، وەئەگەر دروست نەبوو بەووشەیەك لەپێش ئەوەوە دەست پێ دەکەینەوە.

٤- (وقف الأختیاری) ڕاوەستانی ئارەزو: لەسەر ووشەیەکە یان کۆتایی ئایەتێکە ئەمیش پێنج جۆرە کەئامانەن:

أ/ (وقف الازم) وەستانی پێویست: وەستانە لەسەر ووشەیەك کەئەگەر بگەیەنرێ بەوەی دوای خۆی دەبێتە تێکدانی مانای ئایەتەکە یان دەبێتە مانایەکی تر کەمانای ئەو ئایەتە ناگەیەنێ (لەبەر ئەوە پێویستە لەسەری بوەستێن) وەنیشانەی ئەم وەستانە (مـ) بچوکە کەلە ناوەڕاستی ئایەتێکدا هەیە یان لەکۆتایی ئایەتدا.

نمونە بۆ ناوەڕاستی ئایەت ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ﴾ الأنعام: ٣٦ .

نمونە بۆ کۆتایی ئایەت: ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ أَصْحَابُ النَّارِ ۘ الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ غافر: (٦-٧).

لەم ئایەتەدا وەستان پێویستە چونکە ئەگەر وەصلی بکەین لەگەڵ ئایەتەکەی تردا دەبێتە هۆی تێکدانی مانای ئایەتەکە.

ب/ (وقف التام) وەستانی تەواو: بریتییە لەوەستان لەسەر ووشەیەك کەمانای ئایەتەکە لەو وشەیەدا تەوا بووبێ وەپەیوەندی نەبێ بەوەی بەدوایدا دێ نەلەمانادا وەنەلە زمانەوانیدا (المعنى واللفظ).

وەحوکمی ئەم وەستانە دروستە، باشتریش وایە بوەستی. نمونە: ﴿هَـٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ﴾ (ص:٤٩)

وەستان لەسەر (ذکر) تەواوە چونکە ئەو رستەیە پەیوەندی نییە بەورستەیەی کە بەدوایدا دێ و نەلەرووی مانا و نەلەرووی زمانەوانیشەوە.

ج/ (وقف الكافي) وەستانی کیفایەتی: حوکمی ئەم وەستانە وەك حوکمی وەستانی تەواو وایە کەئەویش وەستانە لەسەر ووشەیەك پەیوەندی نییە بەوەی بەدوایدادێ لەرووی (إعرابەوە) بەڵام لەرووی ماناوە پەیوەندی هەیە پێوەی نمونە وەك وەستان لەسەر (نُفُوسكم) في قوله تعالى ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ...﴾ الأسراء: ٢٥.

د/ (وقف الحسن) وەستانی باش: حوکمی ئەم وەستانە دروستە باش وایە بەوەی کە بەدوای وەستانەکەدا دێ دەست پێ نەکەینەوە بەڵام ئەگەر کۆتایی ئایەت بو هیچی تیانییە بەوەی بەدوای دادێ دەست پێ بکەینەوە کەسەرەتای ئایەتێکی ترە.

پێناسەکەی: وەستانە لەسەر ووشەیەك کەمانایەکی باش دەگەیەنێ بەڵام لەرووی ماناو زمانەوانییە وە پەیوەندی هەیە بەوەی کەبەدوای دادێ وەلەناوەراستی ئایەت و کۆتایی ئایەتدا هەیە.

نمونە: وەستان لەسەر (الحمد لله) لە ﴿الحمد لله رب العالمين﴾ کەوەستان لەسەر (الله) باشە چونکە ماناکەی تەواوە بەڵام دەست پێ کردنەوە بە﴿رب العالمين﴾ باش نییە چونکە پەیوەندی هەیە بە (الحمد الله) وە لەرووی ماناو زمانەوانییەوە لەبەر ئەوە پێویستە بە (الحمد لله) دەست پێ بکرێتەوە.

١- وەستانی نادروست: وەستانە لەسەر ووشەیەك کەمانایەکی تەواو نابەخشی وەپەیوەندیشی هەیە بەوەی بەدوایدا دێت لەرووی مانا و زمانەوانییەوە.

١- وەکو وەستان لەسەر (بسم) لە (بسم الله الرحمن الرحيم)دا حوکمی ئەمە دروست نىیە مەگەر بۆ ناچاری بێت ئەگەر وەستاین دەبێ بەوە دەست پێ بکەینەوە کەلەسەری وەستاوین یان بەوەی پێشتری بەپێی پێویستی ماناکەی.

٢- وەستان لەسەر ئەمانە:

(إنَّ الله لايستحی ، ان الله فقير ، إن الله لايهدي) حوکمی ئەم وەستانە دروست نىیە ئەگەر بەئارەزو لەسەری وەستا، مەبەستیشی ئەو مانایە بێت کەئایەتەکە بەو شێوەیە دەیبەخشێ ئەوە (کوفرە).

وە ئەگەر وەستا بەئارەزو وە مەبەستی ئەومانا خراپە نەبوو ئەوە (تاوانە).

بەڵام ئەگەر ئارەزو نەبوو وەلەگەڵ وەستانەکە مەبەستی ئەو مانا خراپە نەبو ئەوە (تاوانبار نىیە).

***تێبینی:***

لەقورئاندا لە هەندێ شوێندا ئەم نیشانەیە (∴) هاتووە لەسەر دوو وشە بەدوایەکدا ئەگەر لەسەر ووشەی یەکەم وەستای کەئەم نیشانەیەی لەسەرە ئەوا لەسەر ئەوی تریان ناوەستی وەئەگەر لەسەر یەکەمیان نەوەستای لەسەر دووەم دەوەستی.

نمونە: ﴿الم × ذلكَ الكِتابُ لارَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِينَ﴾

# پێرست


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی | ١ |
| وانەی یەکەم: تەجوید | ٢ |
| وانەی دووەم: یاساکانی نونی ساکینەو تەنوین | ٤ |
| وانەی سێیەم: تێهەڵ کێش کردن بە مینگەوە | ٦ |
| وانەی چوارەم: تێهەڵ کێش کردنی بێ مینگە | ٨ |
| وانەی پێنجەم: تێهەڵ کێش کردنی لێک چووەکان | ١٠ |
| وانەی شەشەم: تێهەڵ کێشی پیتە هاوڕەگەزەکان | ١١ |
| وانەی حەوتەم: تێهەڵ کێشی پیتە لەیەک نزیکەکان | ١٣ |
| وانەی هەشتەم: تێهەڵ کێشی شەمسی | ١٤ |
| وانەی نۆیەم: ئاشکراکردنی پیتەکانی قورگ | ١٥ |
| وانەی دەیەم: ئاشکراکردنی پیتە لێوییەکان | ١٧ |
| وانەی یانزەهەم: ئاشکراکردنی قەمەری | ١٩ |
| وانەی دوانزەهەم: شاردنەوەی تەواو | ٢٠ |
| وانەی سیانزەهەم: شاردنەوەی پیتە لێوییەکان | ٢٢ |
| وانەی چواردەهەم: هەڵگەڕانەوە | ٢٣ |
| بەشی دووەم: شوێنی دەرچوونی پیتەکان | |
| وانەی پانزە: پیتەکانی پوک و پیتە فیکەیییەکان | ٢٦ |
| وانەی شانزە: پیتەکانی چرپەو پیتە بەرەو ژوور بووەکان | ٢٧ |

وانەی حەڤدە: یاساکانی (ڕا) ........................ ٢٩
وانەی هەژدە: پیتەکانی قەلقەلە........................ ٣١
بەشی سێیەم : ڕەوشتەکانی پیت
وانەی نۆزدە: مەدد ........................ ٣٤
جۆرەکانی مەدد ........................ ٣٥
وانەی بیست: مەددی لکاو + مەددی جیا + مەددی گۆڕاو ........ ٣٧
وانەی بیست و یەک: مەددی پێویست ........................ ٣٩
وانەی بیست و دوو: مەددی پێویستی پیتی ........................ ٤١
وانەی بیست و سێ: : مەددی تووش هاتوو بە سکون ............ ٤٣
وانەی بیست و چوار: مەددی (هاء) ڕاناو ........................ ٤٤
وانەی بیست و پێنج: چەند مەددێکی تر ........................ ٤٦
وانەی بیست و شەش: وەستانەکان لە قورئانی پیروزدا ........ ٤٨
شێوەی دابەش کردنی مەددەکان ........................ ٤٩
پێرست ........................ ٥٠

